وانـەی یەکەم (1)

---------------------------------------------

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ، والحمد لله رب العالمين ، والعاقبة للمتقين ، والصلاة والسلام على عبده ورسوله وأمينه على وحيه وخليله وصفوته من عباده نبينا وإمامنا وسيدنا محمد بن عبدالله ، وعلى آله وأصحابه ، ومن سلك سبيله ، واهتدى بهداه إلى يوم الدين .

أما بعد.

---------------------------------------------

پێناسەی " الولاء " لەڕووی زمانەوانیدا:

الولاء : بنچینەکەی لە فعل دا ( ولي )ە ، دەلالەت دەکات لەسەر نزیک بوونەوە ، إبن فارس وای فەرمووە لە [ معجم ]ەکەی.

داتاشراو ( اشتقاقات )ەکانی وشەی " الولاء " لە زمانەوانیدا:

( الولي ، المولى ، الوالي ، الموالي ، الولاء ، الموالاة ، الولاية ، التولي )

وە " الولایة " بە فەتحە و كەسرەی سەر واو ەكە دەخوێندرێتەوە: {مَالكم مَن ولايتهم من شيّء}.واتە : بۆ ئێوە نییە هیچ جۆرە دۆستایەتییەكیان بكەن. [سورەتی الأنفال : ٧٢ . تەفسیری پوختە ]

بە كەسرە و فەتحە دەخوێندرێتەوە ، وە هەردووكیشیان بە واتای سەرخستن و پشتگیری كردن دێت ، وە هەر لەمەشەوە ناوی " ولایة " لە شارێک نراوە چونكە خەڵكەكەی لە یەكتر نزیكن و یەكتری سەردەخەن ، وە ناوی " الوالي "یش لە حاكم و فەرمانڕەواكەی نراوە چونكە ئەو نزیكە لێیانەوە وە هەروەها هەوڵی سەرخستنیان دەدات.

وە " الولي " : ناوێكە لە ناوەكانی الله عز وجل ، وە ماناكانی " الولي " بریتییە لە : دۆست و پشتیوان و سەرخەر و نزیک و سەرپەرشتیكار.

❄ ئەو واتایانەی كە دەلالەت لەسەری دەكات لە ووشەی " الولاء " لە زمانەوانیدا :

خۆشەویستی ، سۆز و بەزەیی ، ڕازی كردن ، گوێڕایەڵی كردن ، شوێن كەوتن ، سەرخستن ، یارمەتی دان ، هاوكاری كردن ، نزیک بوونەوە ، هاوپەیمانی كردن ، هاوەڵایەتی كردن ، وە هەموو ئەو واتایانەی لێ وەرگیراوە هەروەها پێكهاتووە لە واتای شەرعی.

پێناسەی " الولاء " لە زاراوە و دەستەواژەی شەرعیدا: هەرشتێک كە ڕوودات و بە دەست بهێنرێت لەنێوان بەندەكان لە : یەكتر خۆشویستن و سۆز و بەزەیی دەربڕین بۆ

یەکتر وە سەرخستنی یەکتر وە هاوکاری و یارمەتی دانی یەکتر وە لەیەک نزیک بوونەوە و هاوپەمانی بەستن لەگەڵ یەکتر و لەگەڵ یەک بوون بە برا وە ڕازی بوون لە یەکتر وە گوێڕایەڵی کردن و ئامۆژگاری کردنی یەکتر و هاوڕێیەتی کردنی و برادەرایەتی کردن وە پەیوەندی بەستن و شوێنکەوتن و لایەنگیری کردن و میهرەبان بوون و ڕێزگرتن ، وە هەموو ئەو شتانەی کە پێویستە هەبێت لەنێوانیان لە خۆشەویستی دا، وە سەرخستن لە پێناوی دیندا وە لەبەر ووشەی تەوحید دا.

جا واجبە لەسەر مرۆڤی موسلمان کە پشتیوانی و دۆستایەتی ئیمانداران بکات وە دوور بکەوێتەوە و وازبهێنێت لە دۆستایەتی کردنی کافران ، وە لە گەورەترینی حەڕام کراوەکان لەدوای شیرک دۆستایەتی کردنە لەگەڵ دوژمنە بێ باوەڕەکان بە اللە وە دوژمنایەتی کردنی أولیاء ە باوەڕدارەکانە بە اللە.

جا واجبە لەسەر موسلمانان کە هەندێکیان لەگەڵ هەندێکی تریان وەک یەک لاشە وابن ، جا دەبێت ببنە برا لەگەڵ یەکتر و یەکتری سەربخەن هەروەکو چۆن پەروەردگار و پێغەمبەرەکەیان فەرمانیان پێ کردووە:

( المسلم أخو المسلم ) واتە : موسلمان برای موسلمانە ، وە ( المؤمن للمؤمن كالبنيان ) واتە : ئیماندار بۆ ئیماندار وەک خانوو وایە.

{لَّا يَتَّخِذِ الْمُؤْمِنُونَ الْكَافِرِينَ أَوْلِيَاءَ مِن دُونِ الْمُؤْمِنِينَ} واتە : نابێت ئیمانداران ، کافران بکەنە پشت و پەناو یارو یاوەری خۆیان لەجیاتی ئیمانداران.

❄ پێناسەی " البراء " لە زمانەوانیدا:

البراء دژی الولاء ە ، جا الولاء و دۆستایەتی بریتییە لە نزیک بوونەوە دژی دوژمنایەتیە کە ئەویش بریتییە لە دوور کەوتنەوە.

وە " البراء " بریتییە لە: ڕزگاربوون و خۆ بە دوور گرتن و دوورکەوتنەوە و پێچەوانە کردن و ناکۆکی کردن و گۆشە گیربوون و واز لێ هێنان.

وە هەروەها لە ماناکانی " البراء " بریتییە لە پچڕاندنی دۆستایەتی و پشتیوانی و خۆشەویستی و سۆز و بەزەیی و سەرخستن.

پێناسەی " البراء " لە شەرعدا: هەموو ئەو شتانەی کە واجبە ئەنجامدانی لەگەڵ کافر لە ڕق لێ بوونەوە و دوژمنایەتی کردن.

لە بەڵگەکانی شەرعدا ماناکانی " الولاء والبراء " هاتووە:

لەوانیش : خۆشویستن و مەوەددە و سۆزو بەزەیی و دۆستایەتی و پشتیوانی و موالات ، وە ڕق لێ بوونەوە و خۆ بەری کردن و دوژمنایەتی و ڕکە بەرایەتی.

وە موالات و معادات زانراوە واتا و گەڕانەوەی بۆ عرف : شەریعەت ڕوونی کردوەتەوە حەقیقەتی موالات و معادات ، هەروەکو چۆن حەقیقەتی عورفی و لوغەوی دەلالەت دەکات لەسەر ئەمە لەگەڵ حەقیقەتی شەرعی ، جا ئەم لەفزانە گەڕانەوەی بۆ عورفە ، لەڕووی ئەوەی کە ماناکەی بزانرێت نەوەک پێویستی بە تەعریف بێت ، جا هەموو

کەسێکی عاقڵ و ژیر دەزانێت کە فوڵان دۆستایەتی بۆ ئەو کەسە هەیە بە کردارەکانی وە کەسێکی تریش دوژمنایەتی بۆ هەیە ، جا ئەم کارە پێویستی بە قیاس و تێڕامان نییە ، جا دۆستایەتی کردنی کافران یان دوژمنایەتی کردنیان دەزانرێت لە ڕێگای کردەوەدا لە ڕووکەشیدا بە تەنها بە ئەنجامدانی ، جا ناکرێت کە نادیار بێت لە مرۆڤی عاقڵ حاڵی دۆستایەتی کردن لە دوژمن دا.

وانـەی دووەم②

"الولاء و البراء " بەڕاستی دۆستایەتی و دوژمنایەتی ڕوکنێکە لە ڕوکنەکانی عەقیدە ، وە مەرجێکە لە مەرجەکانی ئیمان و باوەڕ ، زۆرێک لە خەڵکی بێ ئاگان لەمە وە هەندێک لە خەڵکیش ئەمەیان پشتگوێ خستووە بۆیەش کارەکانیان لێ تێکەڵ بووە و زۆر بە زایەدار بوونە.

وە واتای " الولاء " : بریتییە لە خۆشویستنی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی و هاوەڵان و ئیماندارە موەحیدەکان و سەرخستنیان.

وە " البراء " : بریتییە لە ڕق لێ بوونەوە لە هەرکەسێک کە پێچەوانە و مخالفی الله تعالى و پێغەمبەرەکەی و هاوەڵان و ئیماندارە موەحیدەکان دەکات ، لە کافر و موشریک و مونافق و بیدعەچی و فاسق و تاوانبارەکان.

❄ جا هەموو ئیماندارێکی موەحید کە مولتەزیم و پابەندە بە فەرمان و نەهی و ڕێگریەکانی شەریعەت ، ئەوا واجبە خۆشویستنی و موالات کردن و دۆستایەتی و سەرخستنی.

وە هەر کەسێکیش کە لەمەدا پێچەوانە بوو ئەوا واجبە خۆ نزیک کردنەوە بۆلای الله تعالى بە ڕق لێ بوونەوەی و دوژمنایەتی کردنی و جیهاد کردنی بە دڵ و بە زمان بە گوێرەی توانا و تاقەت و گونجان ، الله تعالى دەفەرموێت: {والمؤمنون والمؤمنات بعضهم أولياء بعض }

واتە : پیاوان و ئافرەتانی باوەڕدار هەندێکیان یارمەتی دەر و خۆشەویستی هەندێکی تریانن .

وە دۆستایەتی و دوژمنایەتی بەهێزترین دەستگری ئیمان و باوەڕە کە ئەویش بریتییە لە أعمال و کردەوەکانی دڵ بەڵام مقتضیات و پێویستیەکانی لەسەر زمان و ئەندامەکان دەردەکەوێت ، پێغەمبەر ( ﷺ ) لە فەرموودەیەکی صەحیح دەفەرموێت: (من أحب لله وأبغض لله ، وأعطى لله ومنع لله ، فقد استكمل الإيمان ) [أخرجه أبو داود]

واتە : هەرکەسێک خۆشەویستی ( بۆ کەسێک یان شتێک ) لەبەر الله بێت وە ڕق لێبوونی ( بۆ کەسێک یان شتێک ) لەبەر الله بێت ، وە شت بەخشین و شت گرتنەوەیشی هەر لەبەر الله بێت ئەوا بەڕاستی ئەو کەسە ئیمانی کامڵ و تەواوە.

وە پلەو پایەی عەقیدەی الولاء والبراء لە شەرعدا زۆر گەورەیە ، لەوانیش:

یەکەم : الولاء والبراء بەشێکە لە واتای شەهادە هێنان ، کە ئەویش ووتنی : ( لا إله ) کە نیوەی ( لا إله إلا الله )یە ، جا ماناکەی بریتییە لە بەرائەت و خۆ بەری کردن لە هەموو ئەو شتانەی کە لە شوێنی الله دەپەرسترێت.

دووەم : الولاء والبراء مەرجێکە لە ئیمان و باوەڕدا ، هەروەکو چۆن الله تعالى فەرموویەتی: {تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ الَّذِينَ كَفَرُوا ۚ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ أَن سَخِطَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ وَفِي الْعَذَابِ هُمْ خَالِدُونَ * وَلَوْ كَانُوا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالنَّبِيِّ وَمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مَا اتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَاءَ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ}

واتە : ئەبینی ( ئەی موحەممەد ( صلى الله عليه وسلم )) زۆربەیان دۆستایەتی ئەکەن لەگەڵ ئەوانەی بێ باوەڕ بوون ، بێگومان زۆر بەد و خراپە ئەوەی کە پێشیان خست بۆ خۆیان ( کردویانە ) کە هۆی خەشم و قینی الله بوو لێیان وە ئەوانە لە سزای دۆزەخدا بێ برانەوە دەمێننەوە * وە ئەگەر ئەوانە بڕوایان بهێنایە بە الله و پێغەمبەر و ئەو بەرنامەیەی کە نێراوەتە خوارەوە بۆ سەری ، ئەو بێ بڕوایانەیان نەدەکرد بە دۆست و برادەر بەڵام زۆربەیان لە ئاین دەرچوون و یاخین لە الله. [سورەتی المائدة : ٨٠ , ٨١ ـ تەفسیری پوختە]

سێیەم : ئەم عەقیدە و بیرو باوەڕە بەهێزترین دەستگری ئیمان و باوەرە ، لەکاتێکدا کە ئیمامی أحمد لە مسند ـەکەی ڕیوایەتی کردووە لە البراء ی کوڕی عازب ( الله لێی ڕازی بێت ) کە فەرموویەتی : رسول الله ( ﷺ ) دەفەرموێت: (أوثق عرى الإيمان الحب في الله والبغض في الله ) واتە : بە هێز ترین دەست گری ئیمان خۆشەویستیە لە پێناوی الله وە ڕق بوونەوەیە لە پێناوی الله.

الشيخ سليمان کوڕی عبدالله کوڕی محمدی کوڕی عبدالوهاب ( رەحمەتی الله لێیان بێت) دەفەرموێت: (فهل يتم الدين أو يُقام عَلَم الجهاد أو علم الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر إلا بالحب في الله والبغض في الله ، والمعاداة في الله ، والموالاة في الله ، ولو كان الناس متفقين على طريقة واحدة ، ومحبة من غير عداوة ولا بغضاء ، لم يكن فرقانًا بين الحق والباطل ، ولا بين المؤمنين والكفار ، ولا بين أولياء الرحمن وأولياء الشيطان)

واتە : جا ئايا دين تەواو و كامل دەبێت ياخود ئاڵای جيهاد يان ئاڵای فەرمان كردن بە چاكە و نەهی كردن لە خراپە بەرپا دەبێت مەگەر بە خۆشويستن لەپێناوی الله و ڕق لێ بونەوە لەپێناوی الله نەبێت ، وە دژايەتی لەپێناوی الله و دۆستايەتی لەپێناوی الله ـدا نەبێت ، جا ئەگەر خەڵكی هەموويان يەک دەنگ بوونايە كە لەسەر يەک ڕێچكە بن ، وە خۆشويستن بەبێ دوژمنايەتی و ڕق و كينە بوايە ، ئەوا هيچ جياوازيەک نەئەبوو لەنێوان حەق وباطل ـدا ، وە لەن ێوان ئيمانداران و كافراندا ، وە لەنێوان دۆستانی الله و دۆستانی شەيطان.

چوارەم : الـولاء والبراء هۆكارێكە بۆ چێژتنی شيرينی ئيمان و چێژی يەقين و دڵنيايی ، لەكاتێكدا لە پێغەمبەرەوە هاتووە ( ﷺ ) كەوا فەرموويەتی: ( ثلاث من وجدهن وجد حلاوة الإيمان : أن يكون الله ورسوله أحب إليه مما سواهما ، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله ، وأن يكره أن يرجع إلى الكفر بعد أن أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار ) [متفق عليه]

واتە : هەركەسێک ئەم سێ شتەی تێدا بێت ئەوا تام و چێژی باوەڕی كردووە ، پێويستە كەوا خۆشەويستی الله و پێغەمبەرەكەی لە هەموو شتێک خۆشەويستتر بێت لەلای ، وە كەسێكی خۆشويست تەنها لەبەر ڕەزامەندی الله بێت ، وە پێی ناخۆش بێت كە واز لە ئيسلام بێنێت و بگەڕێتەوە بۆ كوفر لەدوای ئەوەی كە الله ڕزگاری كردووە لە كوفر ، هەروەكو چۆن پێی ناخۆشە كە فڕێ بدرێتە ناو ئاگرەوە.

وانـەی سێـیەم ③

❄ سووربە لەسەر عەقیدەی ولاء و براء ، وە نەکەی کەمتەرخەمی بکەیت لەمەدا ، چونکە بەهۆی ئەمەوە الله تعالی پیسەکان لە پاکەکان جیاواز دەکاتەوە ، وە بەهۆی ئەمەوە زۆر ئەبێت جوندیەکان کە خاوەنی عیزەت و ڕق و خۆ ئامادە کردن و زەخیرەن ، وە بەهۆی ئەمەشەوە سەردەکەون ، وە هەر بەهۆی ئەمەوەیە بوویت بەو موسلمانەی کە تۆ ئەمڕۆکە لەسەریت.

بەڕاستی لە پێویستیەکانی ئیسلامەتیە کە مرۆڤ دۆستایەتی بکات لەپێناوی الله وە دوژمنایەتیش بکات لەپێناوی الله ، پاڵپشتیش بۆی ووتەی الله تعالی یە کە فەرموویەتی: {لا تَجِدُ قَوْمًا يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخِرِ يُوَادُّونَ مَنْ حَادَّ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَوْ كَانُوا آبَاءَهُمْ أَوْ أَبْنَاءَهُمْ أَوْ إِخْوَانَهُمْ أَوْ عَشِيرَتَهُمْ أُوْلَئِكَ كَتَبَ فِي قُلُوبِهِمُ الإِيمَانَ وَأَيَّدَهُمْ بِرُوحٍ مِنْهُ وَيُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِنْ تَحْتِهَا الأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمْ وَرَضُوا عَنْهُ أُوْلَئِكَ حِزْبُ اللَّهِ أَلا إِنَّ حِزْبَ اللَّهِ هُمُ الْمُفْلِحُونَ } واتە : کەسانێکت دەست ناکەوێ کە باوەڕیان هەبێت بە الله و بە ڕۆژی دوایی کە دۆستایەتی بکەن لەگەڵ ئەوانەی دژایەتی الله و پێغەمبەری الله دەکەن ، هەر چەندە ئەو دوژمنانەش باوکیان بن یان کوڕ و برا و خزمیان بن ، ئەوانە الله باوەڕی لە دڵیاندا چەسپاندووە وە پشتیوانی کردوون بە گیانێك لە لایەن خۆیەوە ، وە دەیانخاتە بەهەشتانێکەوە کە جۆگە ئاوی زۆر دەڕوات بەژێر درەختەکانیاندا بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە ، الله لێیان ڕازی بووە ئەوانیش لە الله

ڕازی بوون ، ئەوانە حیزب اللە ن ئاگادار بن کە تەنها حیزب اللە ڕزگار و سەرفرازن .[سورەتی المجادلة : ٢٢ .تەفسیری پوختە]

ئێمە گەلێکین کە اللە تعالی بە ئیسلام بە عیززەت و بە شکۆی کردین جا هەرگیز بە بێجگە لە ئیسلام بە عیززەت نابین ، وە کۆتایی ئەو ئوممەتە چاک نابێت تەنها بەوەی کە سەرەتای ئەو ئوممەتەی پێ چاک کرا ، وە هیچ کەسێک بە عیززەت نابێت بە دینەکەی تەنها کەسێک نەبێت کە تەحقیقی تەوحیدی کردووە وە ولاء و براء ی بە زیندوویی ڕاگرتووە وە لێی بەدەر کەوتبێت و پێیەوە پابەند بێت لە تەواوی کارو بارەکانی ژیانی و هەڵگەڕانەوەی بارەکانی لە خۆشی و ناخۆشیدا.

﴿ إِنَّا بُرَآءُ مِنْكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ ﴾

واتە : ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی اللە ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ( ئایینی ) ئێوە ، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە اللە ی تەنیا دەهێنن. ...

جا لێرەدا شێوازی ولاء و براء دەردەکەوێت لە دیارترینی ماناکانی ، بۆیە مرۆڤی موسلمان سروشتی خۆی وایە کە ڕقی لە دوژمنانی اللە تعالی و دۆستانی شەیتان دەبێتەوە کە اللە تعالی لەم بارەیەوە فەرموویەتی: ﴿ إِنَّ الشَّيطانَ لَكُم عَدُوٌّ فَاتَّخِذوهُ عَدُوًّا إِنَّما يَدعو حِزبَهُ لِيَكونوا مِن أَصحابِ السَّعيرِ ﴾

واتە : بەڕاستی شەیتان دوژمنی ئێوەیە دەی کەواتە ئێوەش بە دوژمنی خۆتانی دابنێن بێگومان ئەو ( شەیتان ) تاقم و کۆمەڵەکەی بانگ دەکات بۆ ئەوەی ببنە هاوەڵانی ئاگری هەڵگیرساوی دۆزەخ. [سورەتی فاطر : ٦ .تەفسیری پوختە ]

جا ئەگەر برایەتی ئینسانی هەبێت هەروەکو چۆن دەڵێن ئەمە دیارترینی جۆرەکانی برایەتیە لەکاتێکدا ئەمە بە مانای یەکسانی کەسێکی موەحیدە لەگەڵ موشریکێک ، وە ئەمەش نە عەقل قبوڵی دەکات و نە شەریعەتەکانیش دانیان بەمە ناوە ، چونکە مرۆڤ خاوەنی عەقڵ و بیرو باوەڕی خۆیەتی ، وە نەوەک مرۆڤ بە وەسف کردنی بێت بە کەسێکی زیندەوەر.

الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ هُوَ الَّذي خَلَقَكُم فَمِنكُم كافِرٌ وَمِنكُم مُؤمِنٌ وَاللَّهُ بِما تَعمَلونَ بَصيرٌ ﴾ واتە : الله ئەو زاتەیە کە ئێوەی دروست کردووە ئینجا هەندێکتان بێ باوەڕ و هەندێکی تریشتان باوەڕدارن ، وە الله بینایە بەهەر شتێك کە ئەنجامی دەدەن.

[سورەتی التغابن : ٢]

جا مرۆڤی موسلمان مداهنە ناکات و نەرمی نانوێنێت و تەنازول و سەر دانەواندن ناکات لە دینەکەی بۆ ئەوەی موشریکان ڕازی بکات ، بێگومان الله تعالی شایەنترە بەوەی کە لە خۆی ڕازی بکات ، الله تعالی دەفەرموێت: ﴿ وَدّوا لَو تُدهِنُ فَيُدهِنونَ ﴾ واتە : ئاواتە خوازن کە تۆ نەرمی بکەیت ( لە ئایەنەکەتدا ) دەربارەی بیرو باوەڕەکەت ، جا ئەوانیش - ئەو حەلە - نەرمیت لەگەڵ بکەن و ڕێککەون ، واتە : ئەگەر هەر تۆزقاڵێك

لێیان نزیك ببیتەوە و دەست لە بەرنامەکەت شل بکەیت ، ئەوانیش ئامادەن گوێرایەڵ بن! [سورەتی القلم : ٩ .تەفسیری ڕامان]

جا لێرەدا واجبە لەسەر مرۆڤی موسلمان کە بچێتە پاڵ کۆمەڵی موەحیدان و ئیسلامەتیەکەی پاک بکاتەوە و شانازی بە دینەکەیەوە بکات و بەرگری بکات لە عەقیدە و بیرو باوەڕەکەی هەموو ئەمانەش دەبێت ئەنجام بدات حەسەب شوێن و جێگای خۆی .

الشیخ عبداللطیف کوڕی عبدالرحمن آل الشیخ دەفەرموێت: ڕەنگە مرۆڤ هەبێت کە ڕقی لە شیرک ببێتەوە ، وە تەوحیدیشی خۆش بوێت ، بەڵام لێرەدا کەم و کوڕی و خەلەلێک دەهێنێت لەدوای ئەمەوە لە ڕووی نەبوونی بەڕائەت و خۆبەری نەکردن لە موشریکان ، وە لەڕووی وازهێنان لە دۆستایەتی و سەرخستنی ئەهلی تەوحید ، جا بەم هۆیەوە دەبێتە کەسێکی شوێنکەوتەی هەواو ئارەزووی ، داخیل بە شیرک دەبێت لە بەش و شتێکدا کە دینەکەی و ئەوەشی بینای کردووە دەیڕوخێنێت ، دەبێتە وازهێنەر لە تەوحید " أصولا وشعبًا " ، ئیمانەکەی جێگیر نابێت لەگەڵیدا بەو شتەی کە پێی ڕازی بووە ، چونکە خۆشویستن و ڕق لێ بوونەوەی نییە لەپێناوی الله دا ، وە دژایەتی ناکات و دۆستایەتی ناکات لەپێناوی الله ، وە هەموو ئەمەش وەردەگیرێت لە شایەتیدان بە لا إله إلا الله [الدرر السنية : 396/8].

وە هەروەها الشیخ عبد الرحمن کوڕی حسن آل الشیخ ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت: أصلی دینی ئیسلام بریتییە لە ناسینی شیرک و بەڕائەت کردن لێی و ئینکاری کردنی و دژایەتی کردنی ئەهلەکەی ، وە ناسینی تەوحیدە لەسەر حەقیقەتی خۆی و قبوڵ کردنی و خۆشویستنی و دۆستایەتی کردنی ئەهلەکەی.

[مجموعة الرسائل والمسائل النجدية : 59/2]

ئیمامی إبن تیمیة ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت:

أصلی دینی ئیسلام بریتییە لەوەی کە خۆشەویستی لەبەر الله بێت و ڕق لێ بوونەوەش لەبەر الله بێت ، وە دۆستایەتی کردن لەبەر الله و دژایەتی کردن لەبەر الله بێت وە هەروەها عیبادەت و بەندایەتی کردنی الله...

وە ئەمەش بە شوێنکەوتنی رسول الله دەبێت ( ﷺ ) ئەوەی کە ئەو فەرمانی پێ کردووە ئەوا الله فەرمانی کردووە وە ئەوەشی کە نەهی لێ کردووە ئەوە الله نەهی کردووە وە دژایەتی کردنی ئەو دژایەتی کردنی الله یە وە گوێڕایەڵی کردنی ئەو گوێڕایەڵی کردنی الله یە وە سەرپێچی کردنی ئەو سەرپێچی کردنی الله یە.

[منهاج السنة النبوية: 64/3]

وانـەی چـوارەم④

ئیمامی محمدی کوڕی عبدالوهاب ( رەحمەتی الله لێی بێت ) دەفەرموێت :

فنهى سبحانه المؤمنين عن اتخاذ اليهود والنصارى أولياء ، وأخبر أن من تولاهم من المؤمنين فهو منهم ، وهكذا حكم من تولى الكفار من المجوس وعباد الأوثان ، فهو منهم.

[الدررالسنية : ١٢٧/٨]

واتە : الله سبحانە وتعالى نەهی کردووە لەوەی کە یەهود و نەصارا بکرێتە دۆست و پشتیوان ، وە هەروها الله تعالى هەواڵی پێ داوین کە هەرکەسێک لە ئیمانداران دۆستایەتی و پشتیوانیان بکات ئەوا ئەویش لەوانە ، ئا بەم شێوەیە حوکمی ئەو کەسەی کە دۆستایەتی کافران دەکات لە مەجوس و بت پەرستەکان ، ئەوا ئەویش دەبێتە یەکێک لەوان و حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت.

وە هەروەها فەرموویەتی: الرضا بالكفر كفر ، وموالاة الكفار كفر. [الدرر السنية ١٠/ ٣٨] واتە : ڕازی بوون بە کوفر کوفرە ، وە دۆستایەتی کردنی کافرانیش کوفرە.

وە فەرموویەتی: وأنت يا من منّ الله عليك بالإسلام وعرفت أن ما من إله إلا الله ، لا تظن أنك إذا قلت هذا هو الحق وأنا تارك ما سواه لكن لا أتعرض للمشركين ولا أقول فيهم شيئاً لا تظن أن ذلك يحصل لك به الدخول في الإسلام ، بل لابد من بغضهم وبغض من يحبهم ومسبتهم ومعاداتهم كما قال أبوك إبراهيم : { إِنَّا بُرَآءُ مِنكُمْ وَمِمَّا

تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاءُ أَبَدًا حَتَّىٰ تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ}، ولو يقول رجل أنا أتبع النبي وهو على الحق لكن لا أتعرض للات ولا أتعرض أبا جهل وأمثاله ما عليّ منهم لم يصح إسلامه. [الدرر السنيه : ١٠٩/٢]

واته : تۆ ئەی ئەوکەسەی الله منەتی بەسەردا کردووی بە ئیسلامەتی ، وە زانیوتە کە هیچ پەرستراوێک شایستەی پەرستن نییە بەحەق جگە لە الله نەبێت ، وا گومان نەبەیت ئەگەر تۆ گوتت : ئەم تەوحیدە حەقە ، وە من وازم هێناوە لە هەرشتێک کە بێجگە لە الله دەپەرسترێت ، بەڵام پشت هەڵناکەم لە موشریک و هاوبەشدانەران ، وە هیچ شتێک لەبارەیانەوە ناڵێم ، جا وا گومان نەبەیت کە تۆ هاتویتەتە ناو ئیسلامەوە بەڵکو کاتێ دێیتە ناو ئیسلامەوە کە ڕقایەتی هاوبەشدانەران بکەیت و ڕقت لەوەش بێ کە خۆشیانی ئەوێ ، وە پێویستە سوکایەتیان پێ بکەیت ، وە دوژمنایەتیان بکەیت ، هەروەکو چۆن باوکت إبراهیم ( علیه السلام ) فەرمووی:

( ئێمە بێزار و بەرین لە ئێوە وە لەو شتانەش کە دەیان پەرستن لە جیاتی الله ، ئێمە باوەڕمان نییە بە ( ئایینی ) ئێوە ، وە پەیدا بوو لە نێوان ئێمە و ئێوەدا دوژمنایەتی و کینە بۆ هەمیشە تا کاتێك کە بڕوا بە الله ی تەنیا دەهێنن )

جا ئەگەر پیاوێک بڵێت من شوێن پێغەمبەر ( ﷺ ) ئەکەوم و هەر ئەوم پێ هەقە بەڵام پشت ناکەم لە لات و أبو جهل و هاوشێوەکانی ، وە من هەقم پێیانەوە نییە ، ئەوا ئەو کەسە ئیسلامەتیەکەی صحیح و درووست نییە.

وه فەرموویەتی: ومعنى الكفر بالطاغوت أن تتبرأ من كل ما يعتقد فيه غير الله وتشهد عليه بالكفر والضلال وتبغضه ولو كان أباك أو أخاك [مجموعة الرسائل : ٤/ ٣٣].

واته : وه مانای کوفرکردن به طاغوت ئەوەیە کە : خۆت بەری بکەیت لە هەرشتێک کە خەڵکی باوەڕیان پێیەتی لە غەیری الله وه شایەتی بدەیت بەسەریدا بە کوفر و بێ باوەڕی و گومڕایەتی وه ڕق لێ بوونەوەی ئەگەرچی باوکت یان برات بێت.

وه فەرموویەتی: زۆرێک لەوانەی کە بانگەوازی بۆ دین دەکەن کەچی لە " لا إله إلا الله " تێنەگەیشتوون و نازانن ، ئەگەرنا ئەوەی کە موسلمانان هەڵیان گرتبوو لە ئارام گرتن لەسەر ئەمەدا و لە سزا و ئەشکەنجە و زیندانی کردن و لێدان و کۆچ کردن بۆ حەبەشە لەگەڵ ئەوەی کە پێغەمبەر ( ﷺ ) بە بەزەییترینی خەڵکی بوو ئەگەر ڕوخسەتێکی بۆیان بەدی کردبوا ئەوا ڕوخسەتی ئەدا پێیان. [مجموعة التوحيد : 19 ]

وه فەرموویەتی: تمسكوا بأصل دينكم ، أوله وآخره ، أُسِّهِ ورأسه ، وهو شهادة أن " لا إِلَهَ إِلاَّ اللَّه "، واعرفوا معناها ، وأَحِبُّوْا أهلها ، واجعلوهم إخوانكم ولو كانوا بعيدين ! واكفروا بالطواغيت ، وعادوهم ، وأبغضوا من أحبهم ، أو جادل عنهم ، أو لم يكفرهم ، أو قال : " ما علي منهم "، أو قال : " ما كلفني الله بهم "، فقد كذب هذا على الله وافترى ! بل كلفه الله بهم ، وفرض عليه الكفر بهم والبراءة منهم ، ولو كانوا إخوانه أو أولاده!!! فالله الله ! تمسكوا بأصل دينكم ؛ لعلكم تلقون ربكم لا تشركون به شيئا. [الدرر : ١١٩/٢].

واته : دەست بگرن بە أصلی دینەکەتانەوە ، سەرەتا و کۆتاییەکەی ، ئەساسەکەی و سەرەکیەکەی ، ئەویش شایەتی دانە بە ( لا إله إلا الله ) وە ماناکەی بزانن ، شوێنکەوتووانیتان خۆش بوێت ، ئەوان بکەن بە برای خۆتان ، با زۆریش لێتانەوە دووربن لە ڕەچەڵەکدا.

وە کوفر بکەن بە طاغوتەکان ، وە دوژمنایەتیان بکەن و ڕقتان ببێتەوە لێیان ، وە ڕقتان لەوانەش ببێتەوە کە طاغوتەکانیان خۆش دەوێت ، یان ئەوانەی کە بەرگریان لێ دەکەن و مشتومڕیان لەسەر دەکەن ، یان ئەوانەش کە تەکفیریان ناکەن ، یان ئەوانەش کە دەڵێن جا من حەقم چییە بەسەریانەوە ، یان دەڵێن الله داوای لێم نەکردووە ( کە تەکفیریان بکەم و ڕقم لێیان بێتەوە ) ، ئەوا ئەم کەسە درۆی بە دەم الله کردووە و درۆیەکی گەورەی هەڵبەستووە ، بەڵکو الله داوای لێ کردووە و فەرزی کردووە لەسەری کە کوفریان پێ بکات و بەرائەت بکات لێیان ، جا با برا و نەوەکانی خۆشی بن.

جا لەبەر الله دەست بگرن بە أصل ی دینەکەتانەوە ، بە ئومێدی ئەوەی بگەن بە لیقای پەروەردگاری خۆتان و هیچ شەریکی بۆ دانەنێن.

وە فەرموویەتی: بل لا يصح دين الإسلام إلا بالبراءة من هؤلاء . أي الطواغيت . المعبودون من دون الله - وتكفيرهم{ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا} [الدرر ١٠/٣]

واتە : بەڵکو دینی ئیسلام صحیح نابێت تەنها بە بەڕائەت و خۆ بەری کردن نەبێت لەم طاغوتانە . لە هەموو پەرستراوێک لە شوێنی الله . و تەکفیر کردنیشیان ، الله تعالى دەفەرموێت: {فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا} واتە : جا ئەوەی باوەڕی نەبێت بە . طاغوت . ( کە بریتیە لە : هەموو ڕێگە و ڕێباز و هێز و بەرنامە و لادان و بتێک ) و باوەڕی دامەزراو بهێنێت بە الله ، جا بێگومان ئەوکەسە دەستی گرتووە بە بەهێزترین هۆکاری ڕزگارییەوە ، شوێن دامەزراوترین بیروباوەڕ کەوتووە ، کە هیچ پسان و هەڵوەشاندنەوەیەکی بۆ نییە و هەمیشە پتەو و دامەزراوە. [سورەتی البقرة : 256 . تەفسیری ئاسان]

وە هەروەها فەرموویەتی: أصل دين الإسلام وقاعدته أمران:

الأول : الأمر بعبادة الله وحده لا شريك له ، والتحريض على ذلك والموالاة فيه وتكفير من تركه.

الثاني : الإنذار عن الشرك في عبادة الله والتغليظ في ذلك والمعاداة فيه ، وتكفير من فعله ، فلا يتم مقام التوحيد إلا بهذا.

واتە : ئەصلی دینی ئیسلام و بناغەکەی دوو شتە:

یەکەم : فەرمان کردن بە عیبادەت کردنی الله تعالى بە تاک و تەنهایی و بێ شەریک ، هەروەها هاندان لەسەریەوە و پشتیوانی کردنی ، وە کافرکردنی هەرکەس کە وازی لێ دەهێنێت.

دووەم : ئاگەدار كردنەوە لە شيرك لە عيبادەت كردنى الله تعالى دا ، هەروەها توند و تيژى نواندن بەرامبەرى و بەربەرەكانى كردنى ، وە كافر كردنى هەركەس كە ئەنجامى ئەدا ، جا مەقام و پێگەى تەوحيد تەواو نابێت تەنها بەمە نەبێت.

وانـەی پێـنجـەم⑤

❄ الشیخ عبدالرحمن حسن دەفەرموێت: الله تعالی سەرزەنشت کردن و توڕە بوونی خۆی لێیان نوسیوە لەسەر ئەو کەسانەی کە دۆستایەتی کافران دەکەن ، وە مانەوە لە سزا و ئەشکەنجە ، وە ئەمەشی دووپات کردوەتەوە بە جۆرەها دووپات کردنەوە ، پاشان باسی ئەو کەسانەی کردووە کە وەصفیانی پێ کردووە بە نەفی کردنی ئیمان بە الله و پێغەمبەر و ئەو قورئانەشی کە دابەزیوەتە سەری.

کە الله تعالی فەرموویەتی: {بَشِّرِ الْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا * الَّذِينَ يَتَّخِذُونَ الْكَافِرِينَ أولياء} واتە : موژدە بدە بە دوو ڕووەکان بەوەی کە بەڕاستی سزایەکی بە ئازاریان بۆ هەیە * ئەوانەی کە بێ باوەڕان بە دۆست و خۆشەویستی خۆیان دادەنێن بێجگە لە ئیمانداران. [الدرر ٨/ ١٧٣]

وە هەروەها فەرموویەتی دەربارەی ئەم ووتەیەی الله تعالی: {وَمَن يَتَوَلَّهُمْ مِنكُمْ فَإِنَّهُ منهم} واتە : ئەو کەسەی پشت بەوان ببەستێت ، ئەوە هەر لەوانە و ( حسابی ئەوانی بۆ دەکرێت ) [المائدة :51]

وە لەم ئایەتە و هاوشێوەکانی گەورەیی ئەم تاوانە دەزانیت ، وە لەم ئایەتە و بێجگە لەویش لەپێشی و دوای ئەویش کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەمە ڕیددە و هەڵگەڕانەوەیە لە ئیسلام ، ئەمەش زۆر جوان دەردەکەوێت بۆ کەسێک کە تەدەبور دەکات و لێی وورد دەبێتەوە. [الدرر ٨/ ١٨٨]

❄وه فەرموویەتی: زانایان ئیجماعیان هەیە و یەكدەنگن لە هاوەڵان و تابعین و لەوانەی دوای ئەوانیش لەسەر ئەوەی كە مرۆڤ نابێتە موسلمان تەنها بە خۆ داماڵین نەبێت لە شیركی گەورە و خۆبەری كردن لێی و لەو كەسەشی كە شیرك ئەنجام ئەدات ، وە ڕق لێ بوونەوەیان و دوژمنایەتی كردنیان بەگوێرەی هێز و توانا ، وە بە إخلاص و دڵسۆزیەوە كردەوەكان گشتی بۆ الله ئەنجام بدات [الدرر 11/ 545]

❄وه فەرموویەتی: بۆ ئەهلی تەوحید تەوحیدەكەیان تەواو نابێت تەنها بە دوورە پەرێزی و خۆ بەری كردن نەبێت لە موشریكان و دوژمنایەتی كردنیان و تەكفیر كردنیان. [الدرر ١١/ ٤٣٤]

❄وه فەرموویەتی: الله تعالى فەرزی كردووە بەڕائەت كردن لە شیرك و موشریكان ، وە كوفركردن پێیان و دوژمنایەتی كردنیان و ڕق لێ بوونەوەیان و جیهاد كردنیان، {فَبَدَلَ الَّذِين ظَلَمُوا قَوْلاً غَيْرَ أَلَذي قِيلَ لَهم} واتە : ( كەچی ئەوانەی ستەمكار بوون ( ئەوەی پێیان وترا بوو ) گۆڕییان بە قسەیەك كە پێیان نەووترا بوو )

جا دۆستایەتی كردنیان و یارمەتی دانیان و پشتگیری كردنیان و سەرخستنیان بۆ موشریكان بەسەر ئیمانداران ، وە ڕق لێ بوونەوەیان لە ئیمانداران و جنێو پێدانیان لەپێناو ئەمەدا ، ئەوە هەموو ئەم كارانە هەڵوەشێنەرەوەی ئیسلامە ، هەروەكو چۆن قورئان و سوننەت بەڵگەن لەسەر ئەمە. [الدرر ٨/١٩٠]

وانـەی شـەشـەم⑥

وه هەروەها الشيخ عبدالرحمن حسن دەفەرموێت: دەربارەی ئايەتەكەی سورەتی (الممتحنة) :

جا هەركەسێک تەدەبور بكات و وورد بێتەوه لەم ئايەتانەدا ئەوا فێردەبێت و دەزانێت ئەو تەوحيدەی كه الله تعالى پێغەمبەرەكانی بۆی ڕەوان كردووه وه كتێبەكانی بۆی دابەزاندووه وه حاڵی پێچەوانەكارەكانيش دەزانێت لەوەی كه تووشی پێغەمبەران و شوێنكەوتووەكانيان بووه لەلايەن نەفام و لوت بەرز و دۆڕاوەكان ، هەروەها شێخمان فەرموويەتی ( واته محمدی كوڕی عبدالوهاب ) له تێڕوانينی بانگەوازی كردنی پەيامبەر (ﷺ) بۆ قورەيش كه به تەنها الله پەرست بن ، دەردەكەوت لێيان كه ناوبردنی خوداكانيان كه سود و زەرەری نييه ئەوا ئەمەيان به جوێن زانی به خوداكانيان.

جا ئەگەر ئەمەت زانی ئەوا دەزانيت كه مرۆڤ ئيسلامەتی بۆی جێگير نابێت ئەگەرچی الله ی به تاک و تەنها پەرست و وازيشی له شيرک هێنا تەنها ئەو كاتەی كه دوژمنايەتی و ڕق و كينەی موشريكەكان دەردەخات ، هەروەكو چۆن الله تعالى دەفەرموێت: {لا تجدُ قَوَمَا يُؤمنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الآخر يُوٓادُونَ مَنْ حَادَّ اللهُ وَرَسُوله} واته : كەسانێكت دەست ناكەوێ كه باوەڕيان هەبێت به الله و به ڕۆژی دوايی كه دۆستايەتی بكەن لەگەڵ ئەوانەی دژايەتی الله و پێغەمبەری الله دەكەن. [سورەتی المجادلة : ٢٢ . تەفسيری پوختە].

جا ئەگەر لەمە تێگەیشتی بە تێگەیشتنێکی چاک ئەوا دەزانیت کە زۆرێک لەو کەسانەی بانگەشەی دین دەکەن بەڵام لێی نازانێت ، ئەگەر ئەوەی کە موسلمانان هەڵیانگرتبوو لە ئارامگرتن لەسەر ئەمە لە ئەشکەنجە و گیران و کۆچکردن بۆ حەبەشە لەگەڵ ئەوەی کەوا پێغەمبەر ( ﷺ ) بە بەزەییترینی خەڵکی بوو ئەوە ئەگەر ڕوخسەتێکی بۆیان بەدی کردبوا ئەوا ڕوخسەت و مۆڵەتی پێیان دەدا ، جا بزانە الله تعالى چۆن ئایەتی بەسەریدا دابەزاند: {وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللَّهِ فَإِذَا أُوذِيَ فِي اللَّهِ جَعَلَ فِتْنَةَ النَّاسِ كَعَذَابِ اللَّهِ } واتە : هەندێ لەخەڵکی دەڵێن باوەڕمان بە الله هێناوە ئینجا کاتێ سزا بدرێ لەپێناوی الله دا ( لەلایەن کافرانەوە ) ئازار و سزای خەڵکی وەکو ئازارو سزای الله دادەنێ. [سورەتی العنكبوت : ١٠ .تەفسیری پوختە].

جا ئەگەر ئەم ئایەتە دەربارەی کەسانێک بێت کە بە زمانیان ئەمە بڵێن ئەی چجای بگات بە غەیری ئەمە "، واتە هەرکەسێک موافەقەیان بکات بە ووتە و کردەوە بەبێ ئەزیەت و ئەشکەنجە ، ( چجای بگات بە ) پشتگیری کردنیان و هاوکاری کردنیان و بەرگری کردن لێیان و لەو کەسانەشی کە موافەقەیان دەکەن وە نکۆڵی کردنی ئەو کەسەشی کە پێچەوانەیان دەکات هەروەکو چۆن ئەمەش واقیع ە و ڕوویداوە. "

وە فەرموویەتی : جا ئەمە حاڵی هاوەڵانی رسول الله بوو ( ﷺ ) وە لەوەی کە توشیان بوو لەلایەن موشریکەکانەوە لە سەختترین ئەزیەت و ئازار ، جا ئەمە لەکوێیە لە حاڵی ئەو مەفتونانەی کە پەلە دەکەن بۆ چوون بەدەم باطل ەوە وە دێن و دەچن بۆیان و خۆشیان دەوێن و مداهنەیان دەکەن و مەیلی دڵیان بۆیان دەچێت و بە گەورەیان

دادەنێن و مەدح و ستایشیان دەکەن ، جا ئەمان زۆر بەم ووتەیەی الله تعالی دەچن کە فەرموویەتی: { وَلَوْ دُخِلَتْ عَلَيْهِم مِّنْ أَقْطَارِهَا ثُمَّ سُئِلُوا الْفِتْنَةَ لَآتَوْهَا وَمَا تَلَبَّثُوا بِهَا إِلَّا يَسِيرًا } واتە : وە ئەگەر هێرش بهێنرایەتە سەریان لە هەموو لایەکی ( مەدینە ) وە ئینجا داوای کافر بوون و جەنگ کردنیان لێ بکرایە ( دژ بەتۆ ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)) داواکەیان بەجێ دەهێنا ( و بەگوێیان دەکردن ) وە ئەم داوایان دوا نەدەخست ماوەیەکی کەم نەبێت. [سورەتی الأحزاب : 14 . تەفسیری پوختە]

داوای ثەبات و خۆڕاگری لەسەر ئیسلامەتی لە الله تعالی دەکەین ، وە پەنا بە الله دەگرین لە گومڕایی فیتنەکان ئەوەی کە دیارە و ئەوەشی کە نادیارە [الدرر : ٨/ ١٢٤].

